# پەندیاری بۆ نووسەرێکی لاو
# کە چاو لە بەرزان دەگێڕێ

نووسەری یوگۆسلاڤیایی

**دانیلۆ کیش**

وەرگێڕان: زیاد ئەسعەد

دانیلۆ کیش، نووسەری ڕۆمان، کورتەچیرۆک و وتاران، لە ٢٢ی شوبات،ساڵی ١٩٣٥ لە یوگۆسلاڤیای جاران (سربیای ئێستا) لە دایک بووە؛ ڕۆژی ١٥ی ئەیلوول، ساڵی ١٩٨٩ کۆچی دوایی کردووە. چەردەیەک بەرهەمی جوانی لە ڕۆمان، کورتەچیرۆک و وتاری ڕەخنەیی بەجێ هێشتووە. ساڵی ١٩٨٤ کۆمەڵێک پەندیاری و ئامۆژگاریی بۆ نووسەرێکی لاو نووسیون و ئەوا دوای چل ساڵ و شتێک مۆری زمانی کوردیی لێ دەدرێ.

- لە بیروباوەڕی باو و ڕێ و ڕێبازان بەگومان بە. لە میر و شازادەکانیش.
- لە میر و شازادە و مازادان خۆت بەدوور بگرە.
- وریا بە، زمانت بە زمانی ئایدۆلۆژیایان پیس نەبێ.
- بڕوات هەبێ کە لە سەرۆک و ژەنەڕاڵان بەهێزتر و شکۆدارتری، بەس نایهەوێ هێز و هەرەنگی خۆت بە هێز و هەرەنگی ئەوان بەراورد بکەی.
- وا بزانە هێز و دەسەڵاتی سەرۆک و ژەنەڕاڵانت نییە، بەس پێویست ناکا هێز و دەسەڵاتی خۆت بە هینی ئەوان بەراورد بکەی. پێودانی ئەوان بۆ تۆ نابن.
- بڕوات بە پرۆژە و بەرنامەی خەیاڵی و ناڕاستەقینە نەبێ، مەگەر شتێکی وا کە خۆت دەستێکت تێدا هەبێ – یان شتێ خۆت بنیاتت نابێ.
- سەرۆک و میر و شازادە و، خەڵکی بێناو و جەماوەر، وەک یەک ببینە. بە یەک چاو لێیان بڕوانە.
- لەمەڕ ئەو مافە تایبەتی و دەسکەوتانەی لە ڕێی نووسین بەدەستیان دێنی، ویژدانت ڕوون بێ و هەتا پێت دەکرێ، چێژیان لێ ببینە.
- تەگەرە و تووشی و ناخۆشیی پیشەکەت لەگەڵ چەوسانەوەی چینانەیەتی لێ تێکەڵ نەبێ.
- بە پەلەپەلی مێژوو دڵت نەهەژێ و بڕوا بەو خوازەیە مەکە کە باسی شەمەندەفەرەکانی مێژوو دەکا.
- سواری شەمەندەفەری مێژوو مەبە؛ شەمەندەفەری مێژوو پڕوپووچێک پتر نییە.
- هەردەم ئەمەت لە بیر بێت: "ئەو دەمەی ناوەنی ئامانجت دەنگێوی، سەرنجت لەسەر زۆر شتی دیکە لا دەچێ (= وەختێ بە ئامانجێک دەگەی، زۆر شتی دی لەدەست دەدەی.)"
- ئەو وڵاتانەی بە گەشت ڕووت کردوونێ، وتاریان لەبارە مەنووسە. بگرە هەر وتار مەنووسە؛ تۆ ڕۆژنامەنووس نییت.

- بڕوات بە ئامار و ژماران نەبێ؛ هەروا بڕوا بە ڕاگەیانی گشتی مەکە: ڕاستی ئەوەیە کە چاوی ڕووت نایبینێ.
- مەچووە کارگە و کێڵگەی هاوبەش و شوێنکاران: پێشکەوتن ئەوەیە کە چاوی سەر هەتەری لێ ناکا.
- هێندێک خۆت بگرەوە لە مەشقی ئابووری، کۆمەڵناسی و دەروونشیکاری.
- شوێن فەلسەفە و ڕێ و ڕێبازی ڕۆژهەڵاتی مەکەوە؛ دڵ بە بودیزم و مودیزم مەدە؛ شتی چاکتر هەیە خەریکیان ببی.
- لە بیرت بێ کە خەیاڵ بە قەدەر یەک موو لە درۆ و دەلەسان دوورە؛ شتێکی بەترسە.
- مەبە ئەندامی دەستە و مەستان، مەچووە بەرەی ئەم و ئەو؛ لە بیرت بێ، نووسەر هەمیشە تەنیایە.
- گوێچکەی خۆت بە قسەی ئەوانە شل مەکە وا هەموو دەم ئەو قەوانە لێ دەدەنەوە گۆیا دنیای ئێمە لە هەموو دنیایان خراپترە.
- بڕوا بە پەیامهێنان مەکە، تۆ بۆ خۆت پەیامهێنێکی.
- خۆت لێ نەبێ بە پێغەمبەر؛ تەنیا چەکی تۆ، گومانە.
- ویژدانت ئاسوودە و ڕوون بێ: خەم لە شازادە و مازادان نەخۆی؛ تۆ بۆ خۆت شازادەیەکی.
- ویژدانت ئازارت نەدا: نەهێڵی کرێکارانی کانگا خەمان بپەچنە دڵ و دەروونت؛ تۆ خۆشت یەکێکی وەک ئەوان.
- ئەوەت لێ ڕوون بێ، ئەو هزرەی ناکرێ ڕۆشناییی چاپ ببینێ، یەکسەرە نەمانی بەسەردا نایێ. بە چەشنێک هەر دەمێنێ و ڕۆژێ هەر دێ سەر دەربێنێ.
- بەپێی پێداویستی و نیازی ڕۆژ قەڵەمت هەڵمەسووڕێنە. با ڕووداوی ڕۆژ شتت پێ نەنووسێ.
- دنیا هەر ئێستا نییە. هەموو شتێک دە "ئێستا" مەبەستەوە؛ پاشان پەژیوان دەبی.
- ٠ هەموو شت هەڵمەگرە بۆ دوایی؛ دڵ بە هەرمان و نەمری خۆش مەکە؛ لەمەش هەر پەژیوان دەبی.
- لە چارەنووس و باری ئێستای ژیانی خۆت ڕازی مەبە. ئەوە هەر ساویلکەیە دڵی بە ژیانی خۆی داکەوتووە.
- بە چارەنووسی خۆت ڕازی بە؛ چون تۆ بۆ ئەوە هەڵنراوی – هەڵبژێردراوی.
- لە "ڕاستیی ڕەها" خۆت بەدوور بگرە.

- ڕاستییە باوەکان مەکە بە بنێشتەخۆشکەی زاری خۆت.
- متمانەت بەوانە هەبێ کە بۆ ئازادبوونی خۆیان زۆریان نرخی گران گران داوە.
- متمانەت بەوانە نەبێ کە ئەوانی دیکە ناچار دەکەن کە نرخی گران بۆ ئازادبوونیان بدەن.
- مەیکە بە حەکایەتی مێشێ کە بڵێی، هەرچی بەهایەکی هەیە، ڕێژەیییە: ئەوەی ڕاستی بێ، بەهاکانیش پلەبەندیی خۆیان هەیە.
- خەڵات و دیاری لە میر و شازادان وەردەگری، وەری بگرە، قەی ناکا، بەس وریا بە، لە شان و پایەی خۆت دانەبەزینی. خۆت لەوێ بچووک نەبینی.
- لێت ڕوون بێ کە زمانی خۆت، ئەو زمانەی پێی دەنووسی، سەرتۆپی هەرچی زمانی دنیایە. ئاخر هەر ئەو زمانەت هەیە و هیچی دی.
- وا بزانە ئەو زمانەی پێی دەنووسی، ئەنگەز زمانی دنیایە ـ خراپترین زمانی دنیا ـ بەس لەگەڵ ئەمیشە، ئەو زمانەت ناگۆڕیتەوە بە هیچ زمانێکی دیکە.
- نەکەی ڕازی بی کە بتکەن بە کاسەلێس و چڵپاوخۆر، دەنا سەرۆک و مەرۆک هەر وەک پێشدەرگە و دەرگاوانان نانت دەدەن و بە کەیفی خۆیان هەڵت دەسووڕێنن.
- لووتت لە ئاسمان نەخشێ ـ لەخۆبایی نەبی ـ دەنا وەک دەرگاوانی سەرۆکە خوێڕیلەکان دێیە بەر چاوی خوێنەران.
- ڕێ مەدە ئەو بڕوایەت بخەنە دڵ کە قەڵەم و نووسراوی تۆ بە کەڵکی کۆمەڵەکەت نایێ.
- چاوەڕێ مەبە ئەوەی دەینووسی، خەڵک بە کەڵکی کۆمەڵی بزانن.
- پێت وا نەبێ ئەندامێکی بەکەڵکی بۆ کۆمەڵەکەت.
- کارێک مەکە کە خەڵکی خۆت بە مشەخۆرت بزانن.
- وا بزانە غەزەلی خۆت لە وتاری بەباقوبریقی هەرچی سیاسییە بەبایەخترە.
- لەمەڕ هەموو شتێ بیر و بۆچوونت هەبێ.
- لەسەر هەموو شتێ بۆچوونی خۆت مەڵێ.
- وا بزانە وشەکانت هیچ لەسەرت ناکەون.
- وشەکانت هێندە بەهاداران، نەبێتەوە.
- بە ناوی نەتەوە و گەلەکەت قسە مەکە، مەگەر تۆ کێی کە جگە لە خۆت نوێنەریی کەسێکی دیکە بکەی!
- مەبەرە بە دژ و بەرهەڵست، ئاخر تۆ شانت پێ لە شانی شازادان نادرێ، لە دەسەڵات شتێک لەوان ژێراتری.

- مەچووە پاڵ سەرۆک و کاربەدەست و بەگزادان: خۆت کەم مەکە؛ تۆ لە ئەوان زۆر سەرتری.
- دژی نادادیی کۆمەڵایەتی بوێستە، هەتا پێت دەکرێ لەو ڕێیەدا خەبات بکە، بەس نەکەی خەباتەکەت بکەی بە بەزمی دەرکردنی بەیاننامە و ئەو شتە قۆڕانە. وریا بە خۆت نەکەی بە ئامانج ـ کاری گرنگ هەن بیانکەی.
- ڕێ مەدە خەباتی دژی نادادیی کۆمەڵایەتی، خۆت لە بیر بباتەوە، یان ڕێگەکەت لێ بگۆڕێ.
- بە ئەندێشە و بیر و بۆچوونی ئەوانی دی ئاشنا بە، پاشان هەتا دەستت دەگرێ تووڕیان هەڵدە.
- بەرنامە و مەرنامەی سیاسی دامەنێ. تەمەنی خۆت بەو شتانە ڕامەبوێرە: لە بیرت بێ، تۆ لە تواوک و ئاژاوەی ئەم گەردوونە ئەفرێنراوی.
- لەوانە بەری بە کە چارەی بنەڕەتی دەخەنە ڕوو.
- بۆ کەمینەیەکی کەم مەنووسە.
- ئەو دەمەی تێدەگەی کۆمەڵ بە دەنگ و ڕەنگی خۆت دەزانێ، زووزوو لە خۆت بپرسە: "ئەرێ بەڕاست، من خەریکی چیم؟"
- بۆ "خوێنەری ئاسایی" مەنووسە: هەموو خوێنەرەکان ئاسایین.
- بۆ دەستەبژێر مەنووسە، دەستەبژێر لە گۆڕێ نییە؛ ئەتۆ بۆ خۆت دەستەبژێری.
- لە مەرگ و مردن ڕانەمێنی، بەس لە بیریشت نەچێ کە هەتا هەتایە هەر نابی.
- بڕوا بە هەرمان و نەمریی نووسەر مەکە، ئەوە قسەی پڕوپووچی مامۆستایان بوو وا خستیانە مێشکی ئێمەوە.
- زۆریش ڕشت و ویشک مەبە، ئەوە مایەی پێکەنینە.
- زۆر زۆریش قۆشمەچی مەبە، دەنا بەگزادە و مەگزادە کۆڕی خۆیانت پێ گەرم دەکەن.
- مەبە کۆستەبابی و لیبووک کە کۆڕ و مەجلیسانت پێ خۆش کەن.
- دڵ بەو واتەیە مەدە کە دەڵێ: "نووسەران ویژدانی مرۆڤایەتین." چاوت بکەوە و ببینە ئەو هەموو هیچوپووچە قەڵەمیان هەڵگرتووە و خەڵکێکیش بە نووسەریان دەناسێن!
- ڕێ مەدە وەهات لێ بکەن کە وا بزانی تۆ هیچ نییت: چاو لێ کە، بزانە دەسەڵاتداران چەند لە نووسەر و شاعیرانی ئازاد دەترسێن!
- هەرگیز نەکەی خۆت بۆ هیچ ئەندێشە و بیرێک بە کوشت بدەی، کەسیش هان مەدە کە خۆیان لەسەر شتێکی وا دابنێن و بمرن.
- ترسنۆک مەبە و قێزیش لە ترسنۆکان بکەوە.

- لە بیرت بێ کە ئازایەتی، دلێری، نرخ و بەهایەکی زۆر بەرزی هەیە.
- بۆ ساڵیاد و بۆنە و شت قەت شت مەنووسە.
- ستایشنامە مەنووسە؛ دوایە زۆر پەژیوانی دەبی.
- کاتی مردنی پاڵەوانە نەتەوەییەکان پرسەنامە مەنووسە؛ با دوایێ گوستی خۆت نەگەزی.
- ئەگەر ڕاستیت پێ ناگوترێ، دەمی خۆت بگرە و هیچ مەڵێ.
- دوور بە لە نیوە-ڕاستییان.
- دەنگی دوو چەپڵەت هاتە گوێ، خێرا خۆت مەگۆڕە کە بچی و بەشدار بی. ئەسکوێی هەموو دیزان مەبە. لە هەموو بۆنە و یادان دیار مەبە. پێی کەم دەبی.
- چاو لە دەستی کاربەدەست و دەسەڵاتداران مەبە. مەبە بە کلکی منداڵەکانیان. جانتا بۆ هیچکەس هەڵمەگرە.
- بۆ بەچکەدەوڵەمەند و فەرخەسەرۆک و منداڵی کاربەدەست و بەگزادە و دەرەبەگان مەسینەت بەدەستەوە نەبێ. ماستاوچی و مامەحەمەیی لە خۆت مەوەشێنەوە.
- ئەوەندە ڕێز مەنوێنە کە ببێتە بێڕێزی بە خۆت.
- چاوەنواڕی دادپەرستی و ویژدانداری لە هەموو کەس مەکە: "دەم لە دەمی نەفامان مەنێ."
- وریا بە، وات لێ نەکەن کە وا بزانی ڕاستەقینە و بۆچوونی بەجێ بە هەموانە و پێودانێک لە ئارادا نییە.
- کە دوو کەس گفتوگۆ دەکەن، وا دەبێ هەردووکیان هەڵە بن. ئەمە ناکاتە ئەوەی هەردووکیان ڕاست بن. (کارل پۆپەر)
- ئەوە کە بیر و بۆچوونی کەسێک بە ڕاست بزانین، لەو ترسە گەورەیە ڕزگارمان ناکا کە: "دەشێ هەموو ئەوانی دیکەش لەسەر هەق بن."
- لەگەڵ گەوج و گاڵتەجاڕان لەسەر شتێ کە هەر لە خۆتیان بیستووە، چەندوچوون مەکە و بەڵگە و نیشانیان بۆ مەهێنەوە.
- مەبە بە بانگخواز و جاڕچی.
- وریای ئەوانە بە کە بانگ ڕادێڵن و وای دەنوێنن پەیامی پیرۆزیان بە دیاری بۆ هێناوی.
- زۆر بڕوا بە "بیروڕای زانستی" مەکە.
- بڕوات بە سرووش و مرووش نەبێ.
- لە ڕەشبینی و بەدگومانی بەگومان بە، نەخاسمە ئەوانەی ناخی خۆت.

- کۆڕ و کۆبوونەوەیەک کە بۆنی ئایدیۆلۆژیای لێ بێ، مەچوو. لە وتە و وتەزایان دڵ و دەروونت بپارێزە.
- ترست نەبێ و ئازایانە بەو شیعرە بڵێ "قێزەون" کە شاعیرێک لە ستایشی دەسەڵاتدارێکی بێبار دەینووسێ – جا با ئەو شاعیرە ئەراگۆنیش بێ.
- وات لێ نەکەن کە وا بزانی لە شەڕەقەڵەم و نووسین–نووسینی دوو لایەن، هەردووکیان لەسەر ڕێی ڕاستن ـ تەنانەت ئەگەر ئەو دوو لایەنە، سارتەر و کامۆیش بوون.
- خوو مەدەرە هەرزەنووسی. نەکەی هەر وشە ڕیز بکەی. مەبەستت بێ وا بنووسی کە تێت بگەن.
- هەر قوتابخانەیەکی ویژەیی کە بەسەرتدا سەپێنرا، بەبێ دوودڵی ڕەتی بکەوە.
- کە باسی "ڕیالیزمی سۆشیالیستی" هاتە گۆڕێ، لە گفتوگۆ وەرە دەرێ.
- لەمەڕ "ئەدەبی پابەند" وەکوو مێروولان بێدەنگ بە: ئەو باسە بۆ ئوستادەکان بەجێ بهێڵە!
- ڕێی خۆت بگرە و لێ گەڕێ با خەڵک هەر قسە بکەن. (دانتێ)

تەواو.

### واتای چەند وشەیەک

خوازە: مێتافۆر.

ئەنگەز: هەرە خراپ.

چڵپاوخۆر: چڵکاوخۆر.

لووت لە ئاسمان خشان: لەخۆباییبوون. لووتبەرزبوون.

تواوک: بەردی تواوەی بن هەرد.

بەریبوون: بەش لە شتێکدا نەبوون. بێبەشبوون لە شتێ.

دەستەبژێر: ئێلیت، نوخبە.

ڕشت: شێلگیر، شێتگیر – ئەم وشەیە چەند واتای دیکەی هەن کە لێرە جێیان نییە.

ناوەن: ناوەند. ناوەنی ئامانج: ناوەندی ئامانج.

کۆستەبابی: کەسێ کە خۆی خۆی قەشمەر دەکا تا ببێتە بابەت و ببینرێ.

هەرزەنووسی: نووسینی شتی پڕوپووچ و بێمەبەست.